وتاری نۆزدە

زنجیرە وتاری (شیرک و شیرکی گوێڕایەڵیکردن)

# الشرك وشرك الطاعة

## جێگەکانی هەڵگەڕانەوە لە چوونە پەرلەمان-١

## مواطن الرّدة في دخول البرلمان-١


شێخی موجاهید

تقبله الله

أبو علي الأنباري



وەرگێڕان و ئامادەکردنی

پێگەی ڕاستەڕێ






پێگەی ڕاستەڕێ

بسم الله الرحمن الرحيم

وتاری
شێخ ئەبی عەلی ئەنباری - تقبه الله-

وتاری (نۆزدە)

بەناونیشانی
جێگەکانی هەڵگەڕانەوە لە چوونە پەرلەمان -١-
مواطن الرّدة في دخول البرلمان -١-

وەرگێڕانی
پێگەی ڕاستەڕێ



الحمد لله والصلاة والسلام على رسول الله

خوایە حەقمان بە حەق پیشان بدە و یارمەتیمان بدە لەسەر شوێنكەوتنی، وە باتڵیشیمان بە باتڵ پیشان بدە و یارمەتیمان بدە لەسەر ئەوەی لێی دووربكەوینەوە، خوایە ئەوەمان فێر بكە كە سوودمان پێدەگەیەنێت و سوودمەندمان بكە بەوەی فێرمان دەكەیت، پەروەردگارا لەوانەمان بكەیت كە كار بە زانستەكەیان دەكەن، خوایە زانستەكەمان بكە بە بەڵگە و حوججە بۆمان ئەو ڕۆژەی بە دیدارت دەگەین و نەیكەیتە بەڵگە بەسەرمانەوە ئەی چاكترینی بە بەزەییان، ئەی پەروەردگارم سینەم ئاسوودە و گوشاد بكە و كاروبار و هەوڵ وكۆششم بۆ ئاسان بكە و گرێی زمانم بكەرەوە و زمانم گۆیا و پاراو بكە تا لە گوفتارم تێبگەن، پەروەردگارا كردەوەكانم چاك بكە و تەنها بۆ ڕەزامەندی تۆ بێت و هیچ بەشێكی تێدا نەبێت بۆ هیچ یەكێك لە دروستكراوانت، لە پاشاندا:

لە فەزڵ و بەخششی الله تعالى تەواو بووین لە باسی دیموكراسی و ئەو بابەتانەی پەیوەستن پێیەوە و بابەتی بەڵگە هێنانەوەی هەندێك لەوانەی دراونەتە پاڵ ئیسلام لەسەر ئەوەی دیموكراسی لە ئیسلامە، وە لە بابەتی شورا -ولله الفضل والمنة-، باسی ئەمڕۆمان بە ویستی الله تعالى دەربارەی پەرلەمان و حوكمی ئەوانەی دەچنە نێو پەرلەمان دەبێت، جا پشتیوان بە الله عز وجل دەڵێم:

پەرلەمان بریتییە لە یەكێكە لە دەسەڵاتەكانی حكومەتە دیموكراسییەكان، دەسەڵاتی جێبەجێكردن هەیە و دەسەڵاتی تەشریعی هەیە و دەسەڵاتی حوكمدان هەیە، ئینجا قسەمان دەربارەی دەسەڵاتی تەشریعی دەبێت، ئەمە ناوەكەیانە، وە ناوی تریشیان هەیە پێی دەڵێن پەرلەمان و پێی دەڵێن نوێنەران و پێی دەڵێن ئەنجومەنی گەل و پێی دەڵێن ئەنجومەنی میللەت، هەموو ئەو ناوانە بەكاردەهێنرێت بۆ دەسەڵاتی تەشریعی، ئەمە ناوە ڕاستەكەیانە: دەسەڵاتی تەشریعی.

باسەكە دەربارەی ئەوانەیە -ئەوەی دەچێتە نێو ئەم شوێنە- ئایا هەڵدەگەڕێتەوە لە دینی الله عز وجل یان نا؟ وە ئەو جێگەیانە چیین كە پێویستە پێیدا تێپەڕ ببێت بەر لەوەی بپاڵێورێت و دوای ئەوەش كە پاڵێورا؟ وە ئەو جێگەیانەی پێویستە بچێتە ناویانەوە ئایا دەری دەكات لە دین یان نا؟

پێش قسەكردن لەبارەی ئەم وردەكارییانەوە، دەبێت ئاماژە بەوە بكرێت كە ئەمە لە بابەتەكانی پێشهات و نوێیەكانە (مسائل النوازل)، ئەمە لە (النوازل) هەژمار دەكرێت، وە تۆ دەزانیت كە حوكمەكانی پێشهات لە ئیسلامدا، ئیسلام دەوری هەموو ئەو پێشهاتانەی داوە كە لە ژیاندا هەیە تاكو قیامەت، ناكرێت شتێك بێتە پێشەوە لە ژیانی خەڵك بەبێ ئەوەی بۆ ئەم پێشهاتە حوكمێك هەبێت لە شەرعی الله تعالى، بۆیە دەبینی ئەو لقەی (الفرع) دەركەوتووە و ڕوویداوە هەر دەبێت بنچینەیەكی (أصل) هەبێت، وە ئەم لقەش دەگەڕێنرێتەوە بۆ ئەم بنچینەیە.

چونكە ئەو كەسەی بڵێت ئەمە لە پێشهاتەكانە و لە كاروباری سیاسییە و لە كاروباری بەڕێوەبردنە، وە حوكمێك نیە بۆ نموونەی ئەم بابەتانە لە شەرعی الله تعالی، ئەوا ئەم قسەیە ئەمانەی لێدروست دەبێت:

یەكەم: ئەو كەسە دەستەوەسانی داوەتە پاڵ الله عز وجل.

شتێكی تر: وە ئەوەشی لێدروست دەبێت لە قسەی ئەو كەسەی دەڵێت هەندێك پێشهات هەیە هیچ حوكمێكی نیە لە شەرعی ئێمە، بەڵكو دەچێتە نێو باسەكانی سیاسەت و هاوشێوەی ئەمانە، ئەم قسەیە بەدرۆخستنەوەی فەرموودەی الله تعالی لە قورئانی لێدەكەوێتەوە، كە مەبەستم ئەم ئایەتە پیرۆزەیە ﴿ٱلۡيَوۡمَ أَكۡمَلۡتُ لَكُمۡ دِينَكُمۡ وَأَتۡمَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ نِعۡمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلۡإِسۡلَٰمَ دِينٗاۚ﴾[1]، واتە: ئەمڕۆ دینەكەتانم بەكۆتایی گەیاند و ناز و نیعمەتی خۆمم بۆ تەواوكردن و ڕازیم بەوەی كە ئیسلام ببێتە بەرنامە و دینتان. ئەم دینە تەواو كراوە، مادام تەواو و كاملە بۆیە دەوری هەموو پێشهاتەكانی ژیانی داوە تاكو هەڵگیرسانی قیامەت، هەر كەس بڵێت كە ئەم بابەتە دین باسی نەكردووە و حوكمی نیە دەربارەی یان ناچێتە نێو باسی دینەوە یان شتێك لەم ڕووەوە ئەمە ئایەتێك لە پەڕتوكی الله تعالی بەدرۆ دەخاتەوە، وە ئەوە بەدرۆ دەخاتەوە كە دینەكەمان هەموو شتێكی بۆ ڕوون كردووینەتەوە الله تعالی دەفەرموێت﴿وَيَوۡمَ نَبۡعَثُ فِي كُلِّ أُمَّةٖ شَهِيدًا عَلَيۡهِم مِّنۡ أَنفُسِهِمۡۖ وَجِئۡنَا بِكَ شَهِيدًا عَلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِۚ وَنَزَّلۡنَا عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ تِبۡيَٰنٗا لِّكُلِّ شَيۡءٖ وَهُدٗى وَرَحۡمَةٗ وَبُشۡرَىٰ لِلۡمُسۡلِمِينَ ٨٩﴾[2]، واتە: ڕۆژێك دێت لە هەموو ئوممەتێكدا شایەدێك دەنێرین لە خۆیان بۆ سەریان، تۆشمان هێناوە (ئەی محمد ﷺ) كە شایەد بیت لەسەر ئەو خەڵكە، قورئانیشمان بۆ تۆ دابەزاندووە، ڕوونكەرەوەی هەموو شتێكە، هیدایەت بەخش و ڕەحمەتە و مزگێنیشە بۆ موسڵمانان. كەوایە ئەم قورئانەمان ڕوونكەرەوەی هەموو شتێكە، هیچ پێشهاتێك نیە لە ژیاندا حوكمێكی نەبێت لە شەرعی ئێمە (وَنَزَّلۡنَا عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ تِبۡيَٰنٗا لِّكُلِّ شَيۡءٖ وَهُدٗى وَرَحۡمَةٗ وَبُشۡرَىٰ لِلۡمُسۡلِمِينَ)، ئەمە (النازلة)یە كەواتە لەسەر زانایان پێویستە توێژینەوەی تیادا بكەن بۆ ئەوەی بزانن حاڵی ئەو كەسانە چییە كە چوونەتە نێو ئەم شوێنە، وە حاڵی ئەو خەڵكەی بوونی ئەوان لە نموونەی ئەم شوێنە پەسەند دەكەن.

ئیمامی شافیعی -رحمه الله- لە ڕیسالەكەی دەڵێت: "بۆ هیچ یەكێك لە شوێنكەوتووانی دینی الله بابەتێكی نوێی بۆ پێش نایەت ئیللا لە پەڕتوكی الله بەڵگە هەیە لەسەر ڕێگای هیدایەت و ڕێنموونی لەبارەیەوە" ئەمە وتەی ئیمامی شافیعییە، لەوانەیە لە وشەیەك لە وشەكان هەڵەم كردبێت، كەوایە بابەتە نوێ و پێشهاتەكان حوكمیان هەیە لە پەڕتوكی الله عز وجل.

دێینە سەر چوونە پەرلەمان، بۆ زانینی حوكمی شەرع لەبارەی ئەوانە پێویستە زانیاری تەواوت هەبێت

(١) المائدة: ٣.

(٢) النحل: ٨٩.

بە واقیعیان و وشە و زاراوەكانی واقیعیان، پاشان ئەم زاراوانە بخە بەردەم شەرعی الله عز وجل، ئینجا كوفرت بۆ جیا دەبێتەوە لە ئیسلام و بۆت ڕوون دەبێتەوە، وە كەسانێك هەن لێكۆڵینەوە دەكەن لەم واقیعانە یان حوكمی الله عز وجل دەپێكێت كە ئەمەش شتێكی چاكە، وە یان هەڵە دەكات لە گەیشتن بە حوكمەكە، وە ئەوەی هەڵە دەكات دابەش دەبێت بۆ دوو بەش: یان ئەو لە حەق دەگەڕێت بەڵام سەركەوتوو نەبووە لە گەیشتن پێی، وە یان ئەو كەسە خاوەن هەوەس و ئارەزووە هەر بۆیە بە هەڵە گەیشتووەتە حوكمەكە، چۆن جیاوازی بكەین لە نێوان ئەو كەسەی لە حەق دەگەڕێت بەڵام هەڵە دەكات لەگەڵ ئەو كەسەی خاوەنی هەوەس و ئارەزووە؟ لە ڕێگەی گەڕانەوە بۆ حەق كاتێك دەركەوت، جا ئەگەر حەق دەركەوت ئەو كەسەی لە حەق دەگەڕێت و هەڵە دەكات دەبینی دەگەڕێتەوە بۆ حەقەكە، وە ئەگەر حەق دەركەوت و خاوەنی هەوەس و ئارەزوو پێداگر دەبێت لەسەر نـــەگەڕانەوە بۆ حەق، لێرەوە ئەو كەسەی لە حەق دەگەڕێت و هەڵە دەكات جیا دەكەینەوە لەو كەسەی خاوەنی هەوەس و ئارەزووە لە گەڕان لەم بابەتەدا.

بەگوێرەی ئەوەی باسكرا و لە ڕێگەی زانینی حاڵی ئەو كەسانە بەوردی، دەست دەكەین بە توێژینەوە لەو جێگەیانەی ئەوانە پیایاندا تێپەڕ دەبن، جێگەی یەكەم:

هەموو ئەو حیزبانەی بەشداری دەكەن لە پەرلەمانەكان لە ئەنجومەنی تەشریعی پێویستە بەم جێگەیەی یەكەم تێپەڕ ببن، وە ئەم جێگەیەش پێی دەڵێم: پەسەندكردنی دەستور، دەبێت هەموو ئەو حیزبانەی دەیانەوێت بەشداری بكەن لە پەرلەمان و لەم حكومەتە تاغوتییانە -هەنگاوی یەكەم- دەبێت پەسەندی دەستور بكەن، وە لە كاتی لێكۆڵینەوە لە واقیعی خەڵك دەبینی كە ئەوەی ڕوویداوە ئەمەیە:

ئەم دەوڵەتانە حوكم دەكران لە لایەن دەسەڵاتدارانێك كە بە زمانی ڕۆژئاوا پێیان دەڵێن "دیكتاتۆرەكان" واتە ئەوانەی تاك لایەنە حوكم دەكەن، هەندێك خەڵك توانیان ئەو دەسەڵاتدارانە لابەرن، وە كەسانێكی تر هاتن دەیانەوێت حوكم بكەن بە دیموكراسی، لە ئەنجامی ئەم گۆڕانە دیموكراسیخوازەكان پێویستیان بەوە بوو دووبارە دەستور بنوسنەوە؛ چونكە ئەو دەستورەی حوكمی پێدەكرا لە لایەن تاك دەسەڵاتدارەكە -دیكتاتۆر- ناگونجێت بۆ ئەم حكومەتە نوێیە كە دەیانەوێت حوكم بكرێت بە قانونەكان یان بە چەمكی دیموكراسی، لێرەوە دەستیان كرد بە پێكهێنانی لیژنەكان بۆ نووسینەوەی دەستور، جا ئەو لیژنەیەی پێكهێنرا لە عێراق لە ڕافیضە و لە كورد و لە حیزبی عێراقی ئەم دەستورەیان نووسی، پاشان دوای ئەوە خستیانە ڕوو پاشان ...، هەروەها لە میصر و هەروەها لە لیبیا و هەروەها لە تونس و بە هەمان شێوە لە هەموو ئەو وڵاتانەی حوكمی دەكرێت بە دیموكراسی، هەنگاوی یەكەم: پێویستە لیژنەیەك بۆ نووسینەوەی دەستور پێكبهێنن، وە تۆ لە بیرتە چیهان وت دەربارەی لیژنەی نووسینەوەی

دەستور لە وانەکانی پێشوومان، ئینجا کاتێك ئەو کەسانە تەواو بوون لە نووسینەوەی دەستور ئەو کاتە ئەم دەستورە دەخرێتە ڕوو و پیشانی خەڵك دەدرێت تاوەکو پەسەندی بکەن یان پەسەندی نەکەن، ئینجا ئەگەر پەسەند کرا هەنگاوی سێیەم دێت: کە بریتییە لەوەی ئەم حیزبانە پاڵێوراوەکانی ڕادەگەیەنێت بۆ چوونە نێو دەسەڵات، پاڵێوراوەکان دوای دانان و چەسپاندنی دەستور دێن، بۆیە هیچ پاڵاوتن و هەڵبژاردن و چوونە پەرلەمانێك نیە تەنها دوای نووسینەوەی دەستور نەبێت، وە دوای دانان بە دەستور نەبێت، وە هەر ئەمە بوو ڕوویدا لە عێڕاق دوای ئەوەی حکومەتی بەعسییەکان کەوت لە بەرامبەر سوپای ئەمریکی، پێکهێنانی حکومەت لە عێڕاق دواکەوت تاوەکو ٢٠٠٥ هەرچەندە کۆتایی هاتن و کەوتنی دەوڵەتی بەعسییەکان لە ٢٠٠٣ بوو ئەی بۆچی تەواوی ئەم ماوەیە دواکەوتن لە دروستکردنی حکومەت -کە ئەم ماوەیە تەنها حکومەتێکی کاربەڕێکەر بوو- ؟ چونکە تەواو نەببوون لە نووسینەوەی دەستور هەر لەگەڵ تەواوبوونیان لە نووسینەوەی دەستور ئیتر پاڵاوتنەکان دەستی پێکرد و هەڵبژاردنەکان دەستی پێکرد و حکومەتیش پێکهێنرا، بە هەمان شێوە ئەمە بوو لە میصر ڕوویدا، کاتێك هەندێك کەسیان هەڵبژارد و پەرلەمانێك و ئەنجومەنێکی تەشریعییان پێکهێنا، ئەم ئەنجومەنە پێکهێنرا پێش نووسینەوەی دەستور، هەر بۆیەش ئەو هەڵبژاردنانە هەڵوەشێنرانەوە؛ چونکە پێکهێنرابوو پێش نووسینەوەی دەستور.

کەوایە هەنگاوی یەکەم بۆ پاڵێوراوەکان لە چوونە نێو پەرلەمان دەبێت دەستورێك هەبێت ڕێککەوتوو بن لەسەری و کاری پێبکرێت لەناو وڵاتەکەدا.

باسی هەندێك لەوانەت بۆ دەکەم کە دانیاننا و پەسەندیان کرد حوکم بکرێت بە دەستور، یاخود پەلەکردن لە نووسینەوەی دەستور: یەکەمی ئەو کەسانە "إبراهيم نعمة" لە پەیامەکەی بۆ گەورەکەی "جۆن"ـی بەڕێز لە لای ئەو، لە چوارچێوەی ئەو پێشنیارانەی کردی بۆ ئەم خەتەنە نەکراوە وتی "پەلەکردن لە نووسینەوەی دەستور و پێکهێنانی حکومەت"، چونکە حکومەت پێکنایەت تەنها بە دەستور نەبێت، هەروەها مورسی کاتێك گەیشتە ڕیدە -پەنا بە الله- وتی "هەموو هەوڵ و توانام دەخەمە گەڕ بۆ پەلەکردن لە پێکهێنانی لیژنەی نووسینەوەی دەستور"، هەروەها حیزبی عێڕاقی بەشداریان کرد لە نووسینەوەی دەستور لە عێڕاق.

جا ئەوانەش هێنایەکن هەژمار دەکرێن لە هەندێك لەو ئاڕاستە و لایەنانەی بانگەشەی ئیسلامەتی دەکەن، ئەوانە لەو کەسانە بوون کاریان دەکرد لەسەر دروستکردنی لیژنەکە یاخود لە بەشداربووان بوون لە لیژنەی نووسینەوەی دەستور.

هەر حیزبێك دان نەنێت بە دەستور، بەم قانونە کە دەنگی لەسەر دراوە و پەسەند کراوە حوکمی

پێبکرێت، هەر حیزبێك دان نەنێت بە دەستور و قانون ئەوا مۆڵەتی پێکهێنانی حیزبی پێنادرێت، ئەو حیزبانە مەرج لە هەبوونیان ئەوەیە دان بنێت بە دەستور و حوکم کردن بە دەستور پەسەند بکات، بۆیە هەر حیزبێك لەو حیزبانەی ئێستا هەن، ئەگەر حیزبێك لەو حیزبانە پەسەندکردنی دەستور یان حوکم کردن بە دەستور ڕەت بکاتەوە ئەوا ئەم حیزبە قانون مافی هەبوونی پێنادات، بەڵکو لە بنەڕەتدا پێکناهێنرێت.

ئینجا ئەگەر مۆڵەت نەدرێت بە حیزبەکە بۆ پێکهێنانی حیزب، هاوکات هەندێك ڕێکخەریش هەیە بۆ پێکهێنانی حیزب، ماددەی ٣٧ لە قانونی عێراقی دەقی لەسەر ئەمە هەیە، لەسەر ئەوەی ئازادی هەیە بۆ پێکهێنانی حیزبەکان و ئەمەش ڕێکدەخرێت بە قانون، بۆیە ئەوەی مۆڵەتی پێکهێنانی حیزبی نەبێت کەوایە بەدڵنیاییەوە بەشداری ناکات لە هەڵبژاردنەکان، کەوایە بەدڵنیاییەوە نابێتە ئەندامێك لە پەرلەمان و لە حکومەت، بۆیە بنچینەی چوونە نێو حکومەت و پەرلەمان بەهۆی دەستورە پاشان پەسەندکردنی ئەم دەستورەیە، کەوایە مەرجی سەرەکی لەم حیزبانە ئەوەیە ئەم دەستورە پەسەند بکەن، ئەو کەسەی حوکم کردن بەم دەستورانە پەسەند بکات وتەی زانایان چییە لەبارەیانەوە؟

هەر کەسێك حوکم کردن بەم دەستورانە پەسەند بکات لەسەر ئەوەی حوکم بکرێت یاخود حوکم بکات بەم قانون و دەستورانە، ئیبن تەیمیە -رحمە اللە- دەڵێت: "وە زانراوە لە دینی موسڵمانان و بە کۆکبوونی هەموو موسڵمانان کە هەر کەسێك ڕێگە بدات و بە دروستی بزانێت شوێنکەوتنی جگە لە دینی ئیسلام یان شوێنکەوتنی شەریعەتێك جیا لە شەریعەتی محمد ﷺ ئەوا کافرە و کوفرەکەشی وەك کوفری ئەو کەسە وایە کە باوەڕی هێناوە بە هەندێکی قورئان و بێباوەڕ بووە بە هەندێکی تری" ئەمە وتەی ئیبن تەیمیە بوو لە (مجموع الفتاوى)، "وە زانراوە لە دینی موسڵمانان و بە کۆکبوونی هەموو موسڵمانان -واتە جێگەی ئیجماعە- کە هەر کەسێك ڕێگە بدات و بە دروستی بزانێت شوێنکەوتنی جگە لە دینی ئیسلام یان شوێنکەوتنی شەریعەتێکی جیا لە شەریعەتی محمد ﷺ ئەوا کافرە و کوفرەکەشی وەك کوفری ئەو کەسە وایە کە باوەڕی هێناوە بە هەندێکی قورئان و بێباوەڕ بووە بە هەندێکی تری" ئەمە وتەی ئیبن تەیمیە بوو.

وتەیەکی تر هەیە هی (محمد بن إبراهيم بن عبد اللطيف آل الشيخ)ـە، کە لە نەوەکانی محمدی کوڕی عبد الوهاب ـە -رحمە اللە-، پەیامێکی هەیە لەبارەی حوکم کردن بە قانونەکان، لە چوارچێوەی ئەوەی دەیڵێت باسی ئەوە دەکات کە ئەم قانونانە وەرگیراون لە قانونی فەڕەنسی و بەریتانی و ئەمریکی - سەرنجی وتەکەی بدە- "هەروەك چۆن مەحکەمەکان [ئیسلامییەکان] سەرچاوە و بەڵگەنامەیان هەیە کە هەمووی سەرچاوەکەی پەڕتوکی اللە و سوننەتی پێغەمبەرەکەیەتی، جا ئەم مەحکەمانەش -واتە

تاغوتییەکان- سەرچاوەیان هەیە کە ئەویش بریتییە لە قانونی هەڵبەستراو لە چەندین شەریعەتی جیاواز و قانونی زۆر وەك قانونی فەڕەنسی و قانونی ئەمریکی و قانونی بەریتانی و جگە لەوانیش لە قانونەکان و لە مەزهەبەکانی هەندێك لەوانەی دراونەتە پاڵ شەریعەت و جگە لەمانە"، واتە شتێك لە شەریعەت و شتێك لە ئارەزووەکانی جولەکە و نەسارا هەروەك باسمان کرد لە وانەکانی ڕابردوومان، پاشان دەڵێت: "جا ئەم مەحکەمانە لە زۆرێك لە خاك و وڵاتانی موسڵمانان ئامادەکراون بە دەرگا کراوەیی و خەڵکیش بۆی دەچن ڕەوە دوای ڕەوە، حوکم دەکرێت لە نێوانیاندا بەوەی پێچەوانەی حوکمی سوننەت و قورئانە لە حوکمەکانی ئەم قانونە -پاشان دەڵێت- وە پابەند دەکرێن پێیانەوە و دانیان پێدادەنێن لەسەری و بەهۆیەوە حوکمیان دەکرێت، ئینجا چ کوفرێك هەیە لەسەرووی ئەم کوفرەوە؟ وە چ هەڵوەشێنەرەوەیەك هەیە بۆ شایەدی دان بەوەی محمد پێغەمبەری الله ـیە دوای ئەم هەڵوەشێنەرەوەیە؟ "کەوایە هەر کەسێك دان بنێت بەم قانونانە (محمد بن إبراهیم آل الشیخ) دەڵێت: دوای ئەم هەڵوەشێنەرەوەیە هەڵوەشێنەرەوەیەکی تر نیە و دوای ئەم کوفرە کوفرێکی تر نیە، سەبارەت بە وتەی ئیمامی (الشنقیطي -رحمه الله تعالی-) ئەویش لە "أضواء البیان" دەڵێت: "وە بەم دەقە ئاسمانیانەی باسمان کرد ئەوپەڕی دەرکەوتن دەردەکەوێت و ئاشکرایە کە ئەوانەی شوێنی قانونە دەستکردەکان دەکەون کە شەیتان دایناون لەسەر زمانی دۆست و یارانی، پێچەوانە و دژە بۆ ئەوەی الله عز وجل دایناوە لەسەر زمانی پێغەمبەرەکانی(عليهم السلام) بەڕاستی کەس گومان ناکات لە کوفرەکەیان و شیرکەکەیان تەنها ئەو کەسە نەبێت کە الله چاوساغییەکەی نەهێشتووە و کوێری کردووە لە ئاست ڕووناکی وەحی".

کەوایە مەرجی سەرەکی بۆ چوونە نێو و بەشداری کردن لە حوکم و دەسەڵات، بریتییە لەوەی دان بنێت بەم دەستورە و ئەمەش وتەکانی زانایان بوو لەبارەی ئەو کەسەی پەسەندی ئەوە دەکات حوکم بکرێت بە دینێکی جیا لە دینی ئیسلام، دەگەڕێمەوە لای ئەوەی باسم کردووە لەوەی پێشتر وتومە لە وانەکانی پێشوو تاوەکو بزانیت مانای پەسەندکردنی حوکم کردن بەم قانونانە لە لایەن حیزبەکانەوە چییە، یەکەم: وتمان ئەم دەستورانە -بەبێ جیاکردنەوە- لە وەحی شەیتانە و بەڵگەمان هێنایەوە بەم فەرموودەیەی الله تعالی ﴿وَإِنَّ ٱلشَّيَٰطِينَ لَيُوحُونَ إِلَىٰٓ أَوۡلِيَآئِهِمۡ لِيُجَٰدِلُوكُمۡۖ وَإِنۡ أَطَعۡتُمُوهُمۡ إِنَّكُمۡ لَمُشۡرِكُونَ﴾[1] ، ئەمە ئایەتێك بوو بە بەڵگە هێنامانەوە، وە ئەمە حوکمی الله ـیە -عزّ وجل- لەبارەی قانونە نـــاشەرعییەکان.

دووەم شت: بیرتانە وتمان کە ئەم قانونانە دینە، وە بەڵگەمان هێنایەوە بە فەرموودەی الله تعالی﴿أَمۡ لَهُمۡ شُرَكَٰٓؤُاْ شَرَعُواْ لَهُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا لَمۡ يَأۡذَنۢ بِهِ ٱللَّهُۚ﴾[2] ، وە ئەو کاتە وتمان -گەر لە بیرتان بێ- کە دین دابەش

---

(١) الأنعام: ١٢١ .

(٢) الشوری: ٢١.

دەبێت بۆ دوو بەش: دینی حەق کە دینی الله ـیە -عز وجل- ﴿أَفَغَيْرَ دِينِ اللَّهِ يَبْغُونَ وَلَهُ أَسْلَمَ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ طَوْعًا وَكَرْهًا وَإِلَيْهِ يُرْجَعُونَ ۝٨٣﴾[١] ، وە دینی پاشا، کە بەڵگەمان هێنایەوە بە فەرموودەی الله تعالی ﴿مَا كَانَ لِيَأْخُذَ أَخَاهُ فِي دِينِ الْمَلِكِ﴾[٢] ، کەوایە ئەم دینە بەدڵنیاییەوە دینی پاشایە نەك دینی الله عز وجل، جا ئەوەی حوکم بکات بەم دەستورە ئەوا حوکمی کردووە بە دینێکی باتڵ کە هیچ پەیوەندییێکی بە ئیسلامەوە نیە، وە هەروەها ئەو کاتە وتمان ئەم قانونانە هەر هەموویان بەبێ جیاکردنەوە هەموویان حوکمانێکی جاهیلیین، وە بەڵگەمان هێنایەوە بە فەرموودەی الله تعالی ﴿وَإِنَّ كَثِيرًا مِّنَ النَّاسِ لَفَاسِقُونَ ۝٤٩ أَفَحُكْمَ الْجَاهِلِيَّةِ يَبْغُونَ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ اللَّهِ حُكْمًا لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ ۝٥٠﴾[٣] ، دوای ئەوە وتمان ئەم قانون و دەستورانەی کاریان پێدەکرێت لە وڵاتانی موسڵمانان، ئەمانە وەرگیراون لە هەوەس و ئارەزووەکانی جولەکە و نەسارا، وە بەڵگەمان هێنایەوە بە فەرموودەی الله تعالی ﴿وَلَن تَرْضَىٰ عَنكَ الْيَهُودُ وَلَا النَّصَارَىٰ حَتَّىٰ تَتَّبِعَ مِلَّتَهُمْ ۗ قُلْ إِنَّ هُدَى اللَّهِ هُوَ الْهُدَىٰ ۗ وَلَئِنِ اتَّبَعْتَ أَهْوَاءَهُم بَعْدَ الَّذِي جَاءَكَ مِنَ الْعِلْمِ ۙ مَا لَكَ مِنَ اللَّهِ مِن وَلِيٍّ وَلَا نَصِيرٍ ۝١٢٠﴾[٤] ، جا ئەو وەسفانە هەمووی لەبارەی ئەم دەستورەوە وتمان، وە ئەو خەڵکانە و ئەو حیزبانە پەسەندیان کردووە حوکمی پێبکەن و حوکمی پێبکرێت، وە بە هەمان شێوە خەڵکیان هاندا لەسەر ئەوەی حوکم کردن بەم قانونانە پەسەند بکەن، وە بابەتی کۆتایی کە باسمان کرد دەربارەی دەستورەکان، وتمان هەر کەسێك شەریعەتی پێغەمبەرێك بگۆڕێت پاشانیش گوێڕایەڵی بکرێت لەم گۆڕینە ئەوا گوێڕایەڵیکەرەکان ئەو کەسەیان کردووەتە پەرستراو و خوای خۆیان، وە ئەو کاتەش باسی ئەوەمان کرد یکەرەکان ئەو کەسەیان کردووەتە پەرستراو و خوای خۆیان، وە ئەو کاتەش باسی ئەوەمان کرد قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿اتَّخَذُوا أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَانَهُمْ أَرْبَابًا مِّن دُونِ اللَّهِ﴾[٥] ، وە وتمان لیژنەی نووسینەوەی دەستور دەچنە نێو حوکمی ئایەتەکە لە لایەنی لەپێشترەوە؛ چونکە گۆڕانکاریان کردووە لە شەریعەتی رسول الله (ﷺ).

کەواتە ئەو حیزبانە پێویستە بەم جێگەیە تێپەڕ ببن، وە پێویستە دەستور پەسەند بکەن، جا کاتێك دەستوریان پەسەند کرد بەم سیفەتانەی باسم کرد، وە هەروەها وتەی ئیبن تەیمیە و وتەی (محمد بن إبراهيم آل الشيخ) و وتەی (الشنقيطي)ـم بۆم باس کردی کە حوکمی کوفریان دا بەسەر ئەو کەسەی

(١) آل عمران: ٨٣.
(٢) يوسف: ٧٦.
(٣) المائدة: ٤٩ –- ٥٠.
(٤) البقرة: ١٢٠ .
(٥) التوبة: ٣١ .

دان دەنێت بە نموونەی ئەم قانونانە، کەوایە ئەو حیزبانە کاتێك دەچنە نێو ئەم جێگەیە ئەوا ئەمە جێگەیەکی هەڵگەڕانەوەیە، دەردەچن لە دینی الله تعالی.

بابەتێك دەمێنێت، ئەویش ئەوەیە کە ئایا ئەوانە چوونە نێو جێگەکەیان حەڵاڵ کردووە یان نا؟ مورجیئەیەکی پیسی گەمژە دێت کە شتێك لە دینی الله تێناگات، دەڵێت ئایا ئەوانە مەرجی حەڵاڵ کردنیان لێهاتووەتە دی؟ جا بەم شێوەیە دەڵێم: ئەم حیزبانە کاتێك چوونە ناویەوە دوای ئەوەی حوکم کردن بە دەستوریان پەسەند کردووە و خەڵکیشیان هانداوە لەسەر پەسەندکردنەکە، ئایا حەڵاڵیان کردووە کاتێك چوونەتە نێو پەرلەمان یان نا؟ وتەیەکی ئیبن تەیمیە -رحمه الله- هەیە -سەرنج بدە- کە لە "منهاج السنة النبوية" هاتووە دەڵێت: "جا هەر کەسێك ئەوە حەڵاڵ بکات حوکم بکات لە نێوان خەڵك بەوەی ئەو وای دەبینێت دادوەری و ڕاستە لەبری شوێنکەوتنی ئەوەی الله دایبەزاندووە ئەوا کافرە" دێینە سەر ئەم قسەیە بۆ ئەوەی ببینین کاتێك ئەو کەسانە دەچنە پەرلەمان دوای ئەوەی دەستور پەسەند دەکەن، ئایا حوکم کردن بە دەستوریان حەڵاڵ کردووە یان نا؟ -سەرنج بدە- سەرەتا ئەو حیزبانە هەموویان بەبێ جیاکردنەوە ئەوەی دراوەتە پاڵ ئیسلام و جگە لەوانیش هەموویان ئەم دەستورەیان پەسەند کردووە، چونکە ئەگەر پەسەندی نەکەن مۆڵەتی پێکهێنانی حیزبیان پێنادرێت، کەوایە بوونیان لەسەر گۆڕەپانەکە و بوونی بارەگاکان بەڵگەیە لەسەر ئەوەی دەستوریان پەسەند کردووە و بەپێی دەستوریش مۆڵەتی پێکهێنانی حیزبیان بەدەستهێناوە، کەوایە پەسەندکردنەکە کاتێك ئەو حیزبانە دەڵێن پەسەندی دەکەین و ڕازین حوکم بکەین بەم قانون و بەم دەستورە، وشەی (نوافق) بە چی تێبگەین؟ مەگەر ئەمە مۆڵەت و ڕێگەدان نیە؟ مەگەر ئەوە حەڵاڵ کردن نیە؟ کاتێك کەسێك دێت و دەڵێت ڕێگە بە خۆم دەدەم حوکم بکرێت و حوکمیش بکەم بەم قانونە، ڕێگەدانەکە هەر خودی خۆی حەڵاڵ کردنە، بەڵکو ئەوانە خراپتریش دەکەن بەوەی کورتیان نەکردەوە بە مۆڵەت دان بە خۆیان، بەڵکو موسڵمانانیان هانداوە بە هەمان شێوە لەسەر ئەوەی بۆ دەستور بڵێن: بەڵێ، پاڵیاننان بۆ ئەم کارە، پێویستە بڕۆن و دەستور پەسەند بکەن، وە ئەو دروشمانەی دەیاننوسی: بڵێن بەڵێ بۆ دەستور بڵێن بەڵێ بۆ دەستور، کەوایە ئەوان ڕێیان بەخۆیان داوە کە حوکمیان بکرێت و حوکمیش بکەن بەم دەستورە.

بەڵگەیەکی تر لەسەر حەڵاڵ کردنی حوکم کردن بە قانون لە لایەن ئەوانە ئەوەیە بە هەمان شێوە موسڵمانانیان هاندا بۆ پەسەندکردنی حوکم کردن بەم قانونە، بەڵگەی سێیەم لەسەر حەڵاڵ کردنەکە ئەوەیە دوای ئەوەی پەسەندی کرد و موسڵمانانی هاندا لەسەر پەسەندکردنەکە، کاتێك دەگاتە پەرلەمان بەر لەوەی کورسییێك بۆ خۆی بگرێت لەژێر گومەزی پەرلەمان پێویستە لەسەری سوێندی دەستوری بخوات و سوێندی دەستوریش باسی لێوە دەکەین لە جێگەی سێیەم بە ویستی الله تعالی، ناوەڕۆکی ئەم

سوێندە ئەوەیە پاڵێوراو بۆ چوونە پەرلەمان پێویستە سوێند بخوات، دەستی دادەنێت لەسەر پەڕتوکی الله عز وجل و دەڵێت: سوێند دەخۆم بە خوای بەرز و گەورە لەسەر ئەوەی کار بکەم بە دەستور و پارێزگاری لێبکەم و ئەمین بم لە کارکردن بە تەشریعەکانی کارپێکراو لە وڵاتەکەمان، وە دەقی سوێندەکە دوایی دەیخوێنمەوە بە ئیزنی الله تعالی.

کەوایە ئەو پەسەندی کرد وتی: بەڵێ بۆ دەستور، وە خەڵکی هاندا لەسەر ئەوەی بڵێن بەڵێ، پاشان دوای ئەمە سوێندی خوارد لەسەر ئەوەی پارێزگاری بکات لەم دەستورە، وە سوێندی خوارد لەسەر ئەوەی کار بکات بەم دەستورە کەواتە ئێستا کارەکان زیاتر جەخت دەکەنەوە لەسەر حەڵاڵ کردن.

باسی بابەتی چوارەمیشت بۆ دەکەم، دوای ئەوەی وتی: بەڵێ -پەسەندی کرد- وە خەڵکی هاندا لەسەر ئەوەی بڵێن بەڵێ، پاشان سوێندی خوارد بە الله لەسەر ئەوەی کار بکات، ڕۆڵی چوارەم ئەوەیە ئەرکی ئەندامانی پەرلەمان: ماددەی ٤٧ ـیان هەیە لە قانونی عێراقی دەقە لەسەر دوو بابەت: کاری پەرلەمان -چی دەکەن- تەشریعەکان دادەنێن و چاودێری دەسەڵاتی جێبەجێکردن دەکەن، ماددەی ٤٧: ئەرکی ئەندامانی پەرلەمان ئەنجومەنی تەشریعی: دانانی قانونەکانە -ئەمە ئەرکی یەکەمیانە-، ئەرکی دووەمیان: چاودێری کردنی دەسەڵاتی جێبەجێکردن، واتە ئەندامانی ئەم حیزبە ئەوانەی چوونە نێو حکومەت ئەگەر یەکێك لە وەزیرەکان سەرپێچی ماددەیەك لە دەستور یان لە قانون بکات، بۆیان هەیە ئەم وەزیرە بانگهێشت بکەن یان ئەم بەڕێوەبەرە بانگهێشت بکەن یان ئەم بریکارە و لێپرسینەوەی لەگەڵ بکەن لەبەردەم پەرلەمان؛ چونکە سەلماندویانە تۆ سەرپێچی دەستورت کردووە لە فڵانە ماددە و سەرپێچی فڵانە ماددەت کردووە لە قانون.

کەوایە ئەمە چوار بابەت بوو بە هەماهەنگییەوە و بە تاك تاکیەوە، هەر یەکێك لەمانە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئەوانە حوکم کردن بە قانون و حوکم کردن بە دەستوریان حەڵاڵ کردووە، لە سەرەتادا وتیان بەڵێ، وە بەڵێ: ڕێگەدان و حەڵاڵ کردنە، پاشان موسڵمانانیان هاندا لەسەر ئەوەی بڵێن بەڵێ، واتە هانیان دان لەسەر ڕێگەدان و حەڵاڵ کردن، پاشان سوێندیان خوارد بە الله کە کار بکەن بەم دەستورە و پارێزگاری لێبکەن، پاشان دوای ئەمە وەك وەفایەك بۆ سوێندەکەیان کاتێك کەسێك ببینن سەرپێچی دەکات ئەوا لێپرسینەوەی لەگەڵ دەکەن، بۆیە وەك سازشێك لەگەڵ ئەوانە [مەبەستی مورجیئەیە ئەوانەی حەڵاڵ کردن دەکەنە مەرج بۆ تەکفیر کردن] ئایا ئەوانە حەڵاڵیان کردووە؟ بەڵێ ئەمە حەڵاڵ کردنە و ئەمانەش بریتی بوون لە ڕێکخەرەکانی حەڵاڵ کردن لای ئەوانە.

کەوایە جێگەی یەکەم کە پێویستە ئەو حیزبانە بچنە ناویەوە بابەتی پەسەندکردنی دەستورە و ئەوەشی بچێتە نێو ئەم جێگەیە بەو ڕوونکردنەوانەی باسم کرد بۆت، ئەمە کارێکی لە دین دەرچوێنەرە، ئەمەش

بابەتی یەکەم.

بابەتی دووەم -جێگەی دووەم- کە پێویستە ئەندامانی پەرلەمان و حیزبەکانیش بچنە ناویەوە، بابەتی باوەڕبوونە بە فرە حیزبی، سەرنجی ماددەی ٣٧ بدە، سەرنج بدە ئەم ماددەیە لە چی پێکهاتووە: یەکەم - ئەمە لە دەستوری عێراقی- دەڵێت: "ئازادی دامەزراندنی ڕێکخراو و حیزبە سیاسیەکان یان چوونە پاڵیان فەراهەم هێنراوە و ئەمەش ڕێکدەخرێت بە قانون" بابەتەکە ئێستا ئەوەیە کە خەڵك ئازادن حیزب پێکبهێنن بەڵام ئەم حیزبانە ڕێکدەخرێن بەپێی قانون، جا ئەوەی بتوانێت ڕێکخەرەکانی قانون بەدەست بهێنێت بۆ پێکهێنانی حیزب، ئەو کاتە دەستور ڕێگەی پێدەدات حیزبێك دابنێت، هاوکات لە پێشەکی ئەو شتانەی داوایان لێدەکرێت، بریتییە لەوەی چوار هەزار ئیمزا بهێنێت -ئەوەی لە بیرم بێت- چوار هەزار ئیمزا بهێنێت لەسەر ئەوەی ئەو ئەندامی هەیە و ژمارەیان چوار هەزارە -کە گومانی زۆرم وایە زیاتر بێت لەم ژمارەیە- گرنگ ئەوەیە لەو داواکراوە ژمارەیەك بهێنێت کە بیسەلمێنێت ئەوانە هەموویان لەسەر ڕێبازی ئەو حیزبەن کە دەیەوێت پێکیبهێنێت و دەیەوێت ڕایبگەیەنێت، بە چاوپۆشی کردن لە سروشتی ئەم حیزبە.

هەروەها لە چوارچێوەی مەرجەکانی پێکهێنانی ئەم حیزبە: پەسەندکردنی دەستورە، لە چوارچێوەی مەرجەکانی پێکهێنانی حیزب: دژایەتی کردنی ئیرهابە، لە چوارچێوەی مەرجەکانی پێکهێنانی حیزب: نابێت حیزبەکە باڵی سەربازی هەبێت، وەك ئاشکرایە ڕافیضە پابەند نابن بە دەستورەکەیان و بە قانونەکەیان، وا دانراوە نابێت حیزبێك هەبێت لە حکومەت کار بکات و باڵێکی سەربازیشی هەبێت، بەڵام دەبینی فڵانە حیزب ڕێکخراوی بەدر، فڵانە حیزب سریەی سەلام، فڵانە حیزب نازانم چی!، کەوایە بنچینەکە لە دەستور ئەوەیە کە ئەو حیزبەی دەیەوێت بەشداری بکات ڕێگەی پێنادەن هێزێکی سەربازی هەبێت، وە ڕافیضە سەرپێچی دەکەن چونکە ئەوان خۆیان دەسەڵاتدارن لەم وڵاتە -هەروەك دەزانن- لە باشووری عێراق.

چی دروست دەبێت لەسەر ئەم بابەتە؟ چی دروست دەبێت لەسەر ئەوەی بڵێین باوەڕمان هەیە بە فرە حیزبی؟ کە باوەڕبوون بە فرە حیزبی ئەمە زاراوەی من نیە براکانم، نەخێر ئەمە ئەوان وا دەڵێن، ئەوان دەڵێن: باوەڕمان بە فرە حیزبی هەیە، هەمیشە بەم شێوەیە لێدوان دەدەن، وە هەندێك لە وتەکانی سەرانی ئەو حیزبانەتان بۆ دەخوێنمەوە بۆ ئەوەی بزانن مانای چییە "باوەڕمان بە فرە حیزبی هەیە".

ئەم باوەڕبوونە ئەمەی لێدروست دەبێت: یەکەم: شیوعی کە هیچ کەسێك ناکۆك نیە لەبارەی کوفرەکەی، عەلمانی، ئێزیدی، نەسرانی، سابیئی، ئاشوری، کلدانی، هەموو ئەوانە ئەگەر بتوانن پێویستییەکانی قانونی بەدی بهێنن، بۆیان هەیە حیزب پێکبهێنن، کەواتە بنەمای باوەڕبوون بە فرە حیزبی ئەوەیە دان

بنێیت بۆ هەر یەك لەوانە بەوەی مافی ئەوەیان هەیە حیزب پێکبهێنن لە وڵاتانی موسڵمانان، وە من تەنها باسی ئەو چینانەم کرد کە کوفرەکەیان ئەسڵی و بنچینەییە: نەسارا و سابیئە و ئێزیدی، لە پاڵ ئەوانەش شیوعییەکان و عەلمانییەکان؛ چونکە هیچ یەکێك گومانی نیە لە کوفری شیوعی، کەوایە کاتێك باوەڕت بە فرە حیزبییە -ئەوەی دەیەوێت بەشداری بکات لە حوکم و ببێتە ئەندامیش لە پەرلەمان ئەوا پێویستە باوەڕی بە فرە حیزبی هەبێت؛ چونکە حکومەتی دیموکراسی دروست نابێت تەنها لە ژمارەیەك حیزب نەبێت، لەبەرئەوەی ئەگەر تەنها یەك حیزب بێت ئەمە پێی ناوترێت دیموکراسی، ئەمە پێی دەڵێن دیکتاتۆری، جا بەهۆی ئەوەی ئەوان دیموکراسیخوازن کەوایە پێویستە حیزبی جۆراوجۆر هەبن و هەر حیزبێکیش بەشداری دەکەن لە حوکم.

کە دانتنا بۆ ئەو کافرانە بەوەی مافیان هەیە هەبن -بیروباوەڕەکەیان ڕابگەیەنن- ئەم باوەڕبوونە بە فرە حیزبی ئەوەی لێدروست دەبێت کە هۆکارەکانی ڕاگەیاندنیان هەبێت بۆ بانگەشەکردن بۆ خۆیان و بۆ ڕوونکردنەوەی بیروباوەڕیان و بۆ ڕوونکردنەوەی بەرنامەکانیان و ئەوەشی کە دەیانەوێت بهێننە دی، کەوایە ئەمەش بە هەمان شێوە لە چوارچێوەی ئەو شتانەیە کە دروست دەبێت بەهۆی ئەوەی کاتێك دەڵێیت باوەڕم بە فرە حیزبییە.

سێیەم شت: ئەمە مانای وایە تۆ دانتناوە بۆیان کە بانگەواز بکەن بۆ بیروباوەڕیان و بانگەواز بکەن بۆ دینەکەیان لەناو موسڵمانان‌دا، کاتێك نەسڕانییەك دێت و حیزبێك پێکدەهێنێت، حیزبێکی پێکهێنا بانگەواز بۆ چی دەکات لە بارەگاکە؟ بانگەواز دەکات بۆ حیزبەکەی و بانگەواز دەکات بۆ بیروباوەڕی و بانگەواز دەکات بۆ ڕێبازەکەی، وە هەموو هۆکارێکی ڕاگەیاندنی بۆ دابین کراوە بۆ ئەوەی ئەم هۆکارانە تایبەت بکات بە بانگەوازکردن بۆ دینەکەی، بەڵام ئەم شتانە دەرنەکەوتووە لە وڵاتەکەمان -ولله الفضل والمنة؛ چونکە جیهاد بواری نەداوە بە هیچ یەکێکیان کە بارەگایەك بکاتەوە، ئەگەر بەهۆی الله عز وجل نەبوایە کە گەنجانێکی ڕەخساند بۆ ئەوەی جیهادی ئەوانە بکەن، ئەوا حیزبی شیوعییت دەبینی لەناو شاری موصل، وە حیزبە ڕافیضییەکانت دەبینی لەناو شاری موصل، وە نەساڕات دەبینی و سابیئەت دەبینی و ئێزیدیت دەبینی، هەموو ئەوانە بارەگایان بۆ دەکرایەوە لەناو ئەم شارە؛ چونکە لە دانیشتووانی ئەم پارێزگایەن و هیچ یەکێك ناتوانێت دژیان بوەستێتەوە، وە ئێزیدی لە ڕێگەی هۆکارەکانی ڕاگەیاندن بانگەوازی دەکرد بۆ شەیتانەکەی و بۆ پەڕتوکە ڕەشەکەی، وە نە ئێوە و نە منیش نەماندەتوانی هیچ شتێك بکەین لە بەرامبەری و هیچ شتێك لە واقیعدا بگۆڕین تەنها بە هەڵگرتنی چەك و جیهاد کردن لە پێناو الله تعالی نەبێت.

کەوایە دانتنا بە دینەکەیان پاشان دانتنا بەوەی بوونیان هەبێت، پاشان دانتنا بەوەی هۆکارەکانی

ڕاگەیاندنیان هەبێت بۆ ئەوەی بانگەواز بكەن بۆ دینەكەیان، وە تۆ لە بیرتە لە سەرەتای ئازادكردنەكە چەند بارەگا هەبوون لە شاری موصل، وە چەند بارەگای پێشمەرگە هەبوون كە هاتبوونە ناویەوە، وە ئێزیدی هاتبوونە ناویەوە، وە نەساڕا هاتبوونە ناویەوە، وە ئاشورییەكان هاتبوونە ناویەوە، تەنانەت جوولەكەش هاتبوونە ناویەوە! مۆساد هەندێكماڵیان بە كرێ گرتبوو لەناو شاری موصل، بۆچی؟ چونكە ئەمە مافە لە دەستورەكەیان و لە دینەكەیان، هەتاوەكو باوەڕت بە دیموكراسی هەبێت ئەوا لە چوارچێوەی باوەڕبوون بە دیموكراسی ئەوەیە باوەڕت بە فرە حیزبی هەبێت، دانتنا بە بیروباوەڕەكەی پاشان ڕێگەت پێدا بانگەواز بكات بۆ بیروباوەڕەكەی، پاشان ڕێگەت پێدا بە هەمان شێوە بانگی خەڵك بكات بۆ بیروباوەڕەكەی، وە بەدڵنیاییەوە ڕێگەی پێدەدەی بەشداری بكات لە دەسەڵات، ئەگەر بە كۆمەڵێك لە دەنگەكان هات -شیوعی یان نەسڕانی یان ئێزیدی- ڕێگەی پێدەدەی بەشداری بكات؛ چونكە ئەمانە شتانێكی بەیەكەوە بەستراون بەم شێوەیە، حیزبێكی ڕاگەیاند و بانگەشەی كرد بۆ حیزبەكە و هەندێك دەنگی هێنا، پاشان پاڵێورا بۆ چوونە پەرلەمان، هیچ یەكێك ناتوانێت دژیان بوەستێتەوە، بۆچی؟ لەبەرئەوەی ئەمە لە چوارچێوەی باوەڕبوون بە فرە حیزبییە، سەرنج بدە ئیخوانی میصر و هەندێكیان چی دەڵێن لە نموونەی ئەم بابەتانە -لە بابەتی فرە حیزبی- سەرەتا كاتێك بگەڕێیتەوە بۆ ڕۆژنامەی "الشوری" كە بڵاو دەكرایەوە لە شاری موصل لە ٢٠٠٣ - ٢٠٠٤ چاوپێكەوتنی بەدوای یەك دەكرا لەگەڵ ئەمە ناسراو بە "إدریس داود" پێم وابێت ناوەكەی بەم شێوە بوو "إدریس حاج داود" ئەم پزیشكە كە تیاچوو، ئەگەر بگەڕێیتەوە بۆ لێدوانەكانی چاوپێكەوتنی هەیە لەگەڵ گەورە ڕۆژنامەكانی جیهان، وە ئەم كابرایە وای دەزانی كەسێكی گرنگە لە ئەمریكا و لە بەریتانیا، ئەوانەش هەواڵگری بوون دەیانەوێت بزانن ئەو كەسانە دەڵێن موسڵمانین جا حاڵیان چۆنە؟ ئینجا لێیان دەپرسی: ئایا باوەڕتان بە دیموكراسی هەیە؟ بەڵێ، بە فرە حیزبی؟ لە هەموو چاوپێكەوتنێكدا جەختی دەكردەوە لەوەی ئێمە باوەڕمان بە فرە حیزبییە، وە پرسیاری لێكرا: باشە ئێوە دەڵێن ئێمە حیزبێكی ئیسلامیین، ئایا جگە لە موسڵمانان قبوڵ دەكەن؟ دەڵێت: دەرگاكانمان كراوەیە بۆ هەمووان تەنها بهێن، وە هەروەها ئیخوانی سوریا پەنا بە الله لێیان، كاتێك خەڵكی هەڵسان و چەكەكانیان هەڵگرت، هەمیشە دەیانبینی لە دواوەن -پەنا بە الله- لە هۆتێلەكان و لە كەناڵە ئاسمانییەكان و هاوشێوەی ئەمانە، پەیماننامەیەكیان نووسی وتیان: "وە ئەمە پەیماننامەیەكە پێشكەشی دەكەین لەبەردەم الله و لەبەردەم گەل" -بە دەق- نەیاننوسی لەبەردەم الله پاشان لەبەردەم گەل، لەبەردەم الله و لەبەردەم گەل! ، وە ئەوەی خاڵەكانی دەخوێندەوە لەم بڕیارە پیاوێك بوو نازناوی "البیانوني" بوو، لە سوریا لە بیانون نازانم ناوی چیبوو، لەنێو ئەو خاڵانەی دیاریان كردبوو: ئایا سروشتی ئەو حكومەتەی دەمانەوێت چۆنە دوای كەوتنی

نوصەیری بەشار -وابزانم بەندی هەشتەم بوو لە پەیماننامەکەیان- دەڵێت: "دەمانەوێت دیموکراسی فرە حیزبی دەستاودەست کردن بێت" ئەوانە ئیخوانی سوریا و ئەوانەی تریش ئیخوانی عێراق.

لە میصر، سەیربکە، (فرید عبد الخالق) کە لە سەرانی ئیخوانە لە میصر پەنا بە الله لێیان، بۆ گۆڤاری "المُصوّر" دەڵێت: "ئیسلام دژی دامەزراندنی حیزبی سیاسی نیە و دژی دموکراسی نیە، بەڵکو کرۆکی دیموکراسی لە ناوەڕۆکی ئیسلامدایە" ئیسلام دژی دامەزراندنی حیزبی سیاسی نیە، ئەمە وتەی سەرکردەیەکیانە، وتەیەکی تر هەیە، سەرنج بدە ناوەکان: أحمد سیف الإسلام، دەزانی ئەمە کوڕی کێیە؟ کوڕی حەسەن بەننایە، (أحمد سیف الإسلام حسن البنا)، لە چاوپێکەوتنێکدا لە گۆڤاری "المجتمع"، لێیان پرسی: بۆچوونتان چییە و هەڵوێستتان چۆنە لە بەرامبەر مافی پێکهێنانی حیزبەکان بۆ هەموو ئاڕاستەکان و ئەندامبوونەکان و لەنێویشیاندا شیوعییەکان -پرسیارێکی ڕاشکاوانە و ڕوونە- وتی: "ئەم مافەیان بۆ هەیە -پاشان قسەکەی تەواو کرد- وە ئیسلام ئینسان ناچار ناکات لەسەر پابەندبوون بە بیروباوەڕێك (لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِ) "، ئەی گەمژە ئەمە شیوعییە! ئایا مافی ئەوەی هەیە حیزبی هەبێت لەناو موسڵمانان؟! ئەمە بۆچی؟ چونکە ئەو حیزبانە پێویستە باوەڕیان بە فرە حیزبی هەبێت، ئەگەر باوەڕیان بە فرە حیزبی نەبێت وەریان ناگرن، ناتوانێت بارەگایەك بکاتەوە و بەشداری بکات لە هەڵبژاردن و بەشداری بکات لە حکومەت، چونکە ئەمانە لە ڕێکخەرەکانی بەشداری کردنن لە حکومەتە تاغوتییەکان.

باشە، هەتاوەکو دان بنێیت بۆ شیوعی بەوەی مافی ئەوەی هەیە حیزبێك پێکبهێنێت و بانگەواز بکات بۆ حیزبەکەی و بەشداری بکات لە حوکم، باشە، ئەگەر گەیشتە دەسەڵات، بۆچوونت چۆن دەبێ؟ دانتنا بە بوونیان و بانگەواز بکات بۆ خۆی و بەشداری بکات لە هەڵبژاردنەکان و ئیتر زۆرینەشی بەدەستهێنا، ئایا ڕێگەی پێدەدەی حوکمان بکات؟ سەیری ئەحمەد یاسین بکە چی دەڵێت، لە چاوپێکەوتنێکی ڕۆژنامەوانی لەگەڵیدا هاوکات ئەم قسەیە (أبو بصیر الطرطوسي) گواستویەتیەوە کە کەسێکی خراپە، لە پەڕتوکەکەی: "حُکم الإسلام في الدیمقراطیة والتعددیة الحزبیة" لە دانانی (أبي بصیر الطرطوسي)، گفتوگۆیەکی لەگەڵ ئەحمەد یاسین گواستوەتەوە لە پەرتوکێکدا، ئەم پەڕتوکەش ناوی "أحمد یاسین الظاهرة المعجزة وأسطورة التحدي" لاپەڕە (١١٦ - ١١٨) واتە ئەو ئەم قسەیەی گواستوەتەوە لە پەڕتوکێك کە ئەمە ناوەکەی بوو، ناوی پەڕتوکەکە "أحمد یاسین الظاهرة المعجزة وأسطورة التحدي" ئەم قسەیە من لە پەڕتوکی "حکم الإسلام في الدیمقراطیة والتعددیة الحزبیة" وەرمگرتووە، لێیان پرسی: بەڵام گەل دیموکراسی دەوێت جا بۆچی دژایەتی دەکەن؟ ئەحمەد یاسین وەڵام دەداتەوە: "وە منیش بە هەمان شێوە دیموکراسییم دەوێت کە فرە حیزبی بێت و دەسەڵاتیش تیایدا بۆ ئەو کەسە بێت کە براوە

دەبێت لە هەڵبژاردنەکان" ڕۆژنامەوانەکە لێی دەپرسێت: ئەگەر حیزبی شیوعی براوە بێت ئەو کاتە هەڵوێستت چۆن دەبێت؟ دەڵێت: "تەنانەت ئەگەر حیزبی شیوعییش براوە بێت ئەوا من ڕێز دەگرم لە ئارەزوو و ویستی گەلی فەڵەستینی" -تەواوکەرەکەی- لێیان پرسی: گەلی فەڵەستینی دەوڵەتێکی دیموکراسی فرە حیزبی دەوێت، دەڵێت -کە نووسیویەتی ئەو بە توڕەیی وەڵامی دایەوە- دەڵێت: "واللە ئێمە گەلێکین شکۆمان هەیە و مافمان هەیە، ئەگەر گەلی فەڵەستینی دەوڵەتی ئیسلامی ڕەت بکاتەوە ئەوا ڕێز لە ئارەزوو و ویستی گەل دەگرم و بە پیرۆزی دادەنێم"، [یەکێك لە گەنجەکان پرسیاری لێدەکات دەربارەی ئەحمەد یاسین] جا دەڵێت: ئەوەی لەسەر کورسی دانیشتبوو لە فەڵەستین و دامەزرێنەری بزوتنەوەی حەماس بوو، یەکێك لە گەنجەکان دەڵێت: واتە ئەگەر گەل کوفری بوێت ئەویش کوفر بە پیرۆز دادەنێت! شێخ دەڵێت: ئەمە دەقی قسەکەی بوو، دەڵێت: "واللە ئێمە گەلێکین شکۆمان هەیە و مافمان هەیە، وە ئەگەر گەلی فەڵەستینی دەوڵەتی ئیسلامی ڕەت بکاتەوە ئەوا ڕێز لە ئارەزوو و ویستی گەل دەگرم و بە پیرۆزی دادەنێم" بۆچی؟ چونکە سەر بە حیزبێکە باوەڕی بە دیموکراسی هەیە زیاتر لەوەی باوەڕی بە اللە عز وجل هەبێت.

هەروەها لە چوارچێوەی باوەڕبوونەکە -ئەوەیە باوەڕی هەبێت بە فرە حیزبی- ئینجا کاتێك داندەنێیت بە شیوعی بەوەی مافی بوونی هەبێت و بانگەوازی هەبێت و بەشداری بکات لە دەسەڵات، کەوایە تۆ دانت پێدانا و پەسەندت کرد، جا ئەگەر دەسەڵات بگرێتە دەست بە هەمان شێوە ناتوانیت نکوڵی بکەیت، بۆچی؟ چونکە سەرەتاکەی دەستت پێکرد بە "باوەڕمان هەیە بە فرە حیزبی" بۆیە ئەوەی لەم باوەڕبوونە دروست دەبێت پێویستە تەسلیمی بیت.

[یەکێك لە گەنجەکان پرسیاری لێدەکات دەربارەی سەرچاوەی قسەکانی پێشوو] جا دەڵێت: ئەمە لە پەڕتوکی "حكم الإسلام في الديمقراطية والتعددية الحزبية] سەبارەت بەو قسەیەی باسم کرد لە پێشدا ئەوا لە "الحصاد المرّ" هاتووە لەبارەی (فريد عبد الخالق وأحمد سيف الإسلام) ئەمەیان لە "الحصاد المرّ" بوو.

سەرنج بدە وتەی حەسەن بەننا، ئیبن تەیمیە دەڵێت "جا هەر کەسێك ئەوە حەڵاڵ بکات کە حوکم بکرێت لە نێوان خەڵك بەوەی ئەو وای دەبینێت دادوەری و ڕاستە بەبێ شوێنکەوتنی ئەوەی اللە دایبەزاندووە ئەوا کافرە" بیرم چوو باسی هەندێك وتەی حەسەن بەننا بکەم، پەڕتوکێکی هەیە بەناوی "رسائل حسن البنا" ئەم کابرایە پیرۆزە لە لای ئیخوان هەمیشە قسەکانی بە بەڵگە دەهێننەوە، لەوەی وتویەتی لەم پەڕتوکە لەبارەی دەستور، دەڵێت: "ئیخوان بڕوای وایە سیستەمی حوکمی دەستوری نزیکترین سیستەمی حوکمە لە ئیسلام کە لە هەموو جیهاندا هەیە، وە ئەوان یەکسانی ناکەن لەگەڵ

سیستەمێکی تر" ئەمە وتەیەك، وتەیەکی تری هەیە: "دەکرێت بڵێین لە ئاسوودە کردن و دڵنیابوونەوە کە ڕێسایە سەرەکییەکانی دەستوری میصری لەسەر دامەزراوە دژیەك نیە لەگەڵ ڕێساکانی ئیسلام" وتەیەکی تری هەیە، دەڵێت: "بۆیە ئێمە بە بنەما سەرەکیەکان تەسلیمی حوکمی دەستوری دەبین بەو پێیەی ڕێککەوتە بەڵکو وەرگیراوە لە سیستەمی ئیسلامی" واتە ئیسلام نیە بەڵام وەرگیراوە لە ئیسلام.

دەگەڕێینەوە لای بابەتەکەمان کە بریتییە لە بابەتی باوەڕبوون بە فرە حیزبی، کەوابوو ئەو حیزبانە پێویستە دان بنێن بەو کافرانە کە کوفرەکەیان کوفری ئەسڵیە بەوەی مافی هەبوونیان هەیە و مافی ئەوەیان هەیە بانگەواز بکەن بۆ بیروباوەڕەکەیان لە ناو موسڵمانان، ئەمەش دەچێتە نێو لایەنی: تەکفیر نەکردنیان، چونکە ئەوەی تەکفیریان بکات -بڵێت ئەوانە کافرن- ناکرێت لە هەمان کاتدا بە دروستی بزانێت نەسرانی حیزبی هەبێت و بانگەواز بکات بۆ حیزبەکەی، وە شیوعی حیزبی هەبێت و بانگەواز بکات بۆ حیزبەکەی، وە بە هەمان شێوە ناکرێت پەسەندی ئەوە بکەن ئەگەر ئەوانە براوە بن حوکمی موسڵمانان بکەن و شیوعییەکانیش ئەگەر براوە بوون حوکمی موسڵمانان بکەن، لەوانەیە ئەو بڵێت من تەکفیریان دەکەم -وای دەبینم کافرن- بەڵام باوەڕبوون بە فرە حیزبی یەکناگرێتەوە لەگەڵ تەکفیرکردنی ئەوانە، مادام بڵێی: من باوەڕم بە فرە حیزبی هەیە، کەوایە تۆ ئێستا لەسەر دووڕیانی ڕێگای، ئەوانە کافرن؟ بەڵێ، بە چی تەکفیرت کردن؟ دەڵێت: ئیسلام تەکفیریان دەکات، الله عز وجل دەفەرموێت ئەوانە کافرن، باشە، دەستورەکەت چی دەڵێت؟ دەستورەکەت ڕێگە بە فرە حیزبی دەدات، وە تۆش بەپێی دەستور قسەت کرد و دەتەوێت بە هەمان شێوە بەپێی قورئانیش قسە بکەیت! ناکرێت ئەم دووانە لە یەك کەسدا کۆ بکرێنەوە، ناکرێت بەیەکەوە کۆ بکرێنەوە کە الله تعالی دەفەرموێت﴿لَّقَدْ كَفَرَ الَّذِينَ قَالُوا إِنَّ اللَّهَ ثَالِثُ ثَلَاثَةٍ﴾[1]، پاشان بڵێیت: ئەی نەسرانی مافی ئەوەت هەیە حیزبێکت هەبێت و بانگەوازی خەڵکیش بکەیت بۆ بیروباوەڕەکەت، وە هانیان بدەی بۆ دینەکەت و بەشداری بکەی لە هەڵبژاردنەکان، وە ئەگەر زۆرترین ژمارەی دەنگەکانت بەدەستهێنا دوای ئەمە بۆت هەیە حوکمان بکەیت! ناکرێت ئەم چەسپاندنی بەڵگەیە ڕێکبکەوێت لەگەڵ ئەوەی هاتووە لە دینەکەمان، بۆیە ئەوەی تەکفیریان دەکات دان نانێت بۆیان بە فرە حیزبی، بەڵام ئەوەی دان دەنێت بە فرە حیزبی بۆیان بەدڵنیاییەوە تەکفیریان ناکات، تەنانەت ئەگەر بشڵێت ئەوان کافرن، بۆچی؟

چونکە حوکمی کوفرەکەی هەڵوەشاندووەتەوە بەم مۆڵەتانەی داویەتی پێیان، ئەمە کۆ ناکرێنەوە، ناکرێت بڵێی کافرن و مافی ئەوەشت هەیە بانگەواز بکەیت بۆ دینەکەت و بۆ بیروباوەڕەکەت، ئەو کەسەی ئەم قسەیە دەکات پێویستە لەسەری هەمان قسە بکات لەسەر ئەوەی لە مەککە هەبوو، ئەگەر

(١) المائدة: ٧٣ .

وامان دانا کە پێغەمبەر (ﷺ)دوای ئەوەی الله عز وجل فەتحی مەککەی -الله تعالى گەورە و ڕێزداری بکات- کرد بۆی، ئەگەر ئەو دوای ئەوەی ئەرکەکەی سپارد بە (أُسَيد بن عتّاب (رضي الله عنه)) و بووە پێشەوای مەککە، کۆمەڵێك لە خەڵکی مەککە بێن -حاشا لەو- بڵێن: ئەی (أُسيد) ئێوە هاتوونەتە نێو مەککە و حوکم دەکەن بە دینەکەتان، وە ئێمەش بەردەوام دەبین لە مانەوەمان لەسەر شیرکەکەمان و لەسەر پەرستنی بتەکانمان ئینجا دەمانەوێت ڕێگەمان بدەن کۆمەڵەیەك دروست بکەین و هەروەها بانگەوازی خەڵك بکەین کە هەر کەسێك بیەوێت بتەکان بپەرستێت ئەوا بێتە پاڵ ئێمە، مادام لە پەڕتوکەکەتان (لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِيَ دِينِ ) هەیە، مادام لە قورئانەکەتان (لَآ إِكْرَاهَ فِي ٱلدِّينِ ) هەیە جا ئەم ئایەتانە ناچارت دەکات ئەی (أُسيد) بەوەی ڕێگەمان بدەیت کۆببینەوە و ئێمەش دەمانەوێت بتەکان بپەرستین، وە بانگەواز بکەین بۆ پەرستنی بتەکان و پێویستە لەسەر ئێوەش دژی ئەمە نەوەستنەوە؛ چونکە بابەتەکە بابەتی بازاڕە، تۆ ئیسلام دەخەیتە ڕوو و منیش دەمەوێت ئەو جاهیلیەتەی لە لامە بخەمە ڕوو، پاشان دوای ئەمە بڵێت: کێشە نیە بە هاوبەشی حوکم بکەین، چونکە هەندێك حوکم لە دینەکەتان هاوشێوەیە لەگەڵ دینەکەمان، ئێمە ماڵی الله بە گەورە دادەنێین و تەواف دەکەین بەدەوری کەعبە و بەرز دەبینەوە بەرەو سەفا و مەڕوە و هەروەها قوربانی سەردەبڕین لێرە و ئاو دەدەین بە حاجییەکان و خواردنیان بۆ ئامادە دەکەین و باوەڕمان بە پێغەمبەر ئیبراهیمە و ئیتر بەم شێوەیە، بەڵام هەندێك تەشریعمان هەیە پێویستە پەسەندیان بکەن: (سائبة) و (بَحيرة) و (وصيلة) و زیندە بەچاڵکردنی کچان و کوشتنی منداڵان، پێویستە ئەمانەش پەسەند بکەن هەروەك چۆن ئەوەی لە لای ئێوە هەیە پەسەندمان کردووە! هەر کەسێك ڕێگە بدات بەمەی سەردەم پێویستە لەسەری ڕێگە بەمەش بدات لە سەردەمی رسول الله (ﷺ)؛ یەکسانن هیچ جیاوازییان نیە.

وە تۆ دەزانیت کە ئەوانە هەرچەندە بڵێین ئەوان کافرن ئەوا دانیان پێداناون لەسەر کوفرەکەیان، وە ئەو ڕێسایەی محمدی کوڕی عبد الوهاب باسی کردووە لە هەڵوەشێنەرەوەکانی ئیسلام -وتەیەکی کورتە إن شاء الله و ئینجا تەواو دەبین- دەڵێت: "هەر کەسێك تەکفیری موشریکەکان نەکات یان گومان بکات لە کوفرەکەیان یان ڕێگا و ڕێبازەکەیان بەڕاست بزانێت ئەوا کوفری کردووە" چۆن تەکفیرکردنیان و بەخشینی هەموو ئەو مافانە پێیان بەپێی باوەڕبوون بە فرە حیزبی بەیەکەوە کۆ دەکەیتەوە؟! ئەمە کۆنابێتەوە لەگەڵ ئەمە.

هەروەها پێناسەی ئیسلام -هەروەك ناسراوە لە لاتان- دەڵێت: "ئیسلام: تەسلیم بوونە بە الله بەهۆی یەکخواپەرستی و ملکەچ بوونە بۆ ئەو بە گوێڕایەڵی کردن و بەڕائەت کردنە لە شیرك و ئەهلەکەی" ئەگەرنا کوانێ فەرموودەی الله تعالى﴿ قَدْ كَانَتْ لَكُمْ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ فِي إِبْرَاهِيمَ وَالَّذِينَ مَعَهُ إِذْ قَالُوا لِقَوْمِهِمْ إِنَّا بُرَآءُ مِنكُمْ

﴿وَمِمَّا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ كَفَرْنَا بِكُمْ وَبَدَا بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ ٱلْعَدَٰوَةُ وَٱلْبَغْضَآءُ أَبَدًا حَتَّىٰ تُؤْمِنُوا۟ بِٱللَّهِ وَحْدَهُۥٓ﴾(١) ، بۆیە ناکرێت بۆ کەسێك خۆی بداتە پاڵ ئیسلام باوەڕی بە قورئان هەبێت و باوەڕی بە دەستوریش هەبێت، چونکە ئەمە کۆکردنەوەیە لە نێوان دژیەکەکان و ناشکرێت دوو دژیەك کۆبکرێنەوە لە هەر بارێك لە بارەکان، ئەمەش جێگەی دووەم بوو کە دەبێت ئەوانەی دەیانەوێت بچنە پەرلەمانەکان بچنە نێو ئەم جێگەیەوە،

أقول قولي هذا وأستغفر الله لي ولكم وجزاكم الله خيراً.

**وەرگێڕان و ئامادەکردنی**
**پێگەی ڕاستەڕێ**




(١) الممتحنة: ٤.